ناميلكەی :

🌹(( چەند بنچینەیەک لەعەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە ))🌹

👈 وەرگێرانی : احمد  شارەزوری

👈 جۆری بەرهەم : pdf

👈 دیزاین و کاری pdf :  نێچیرڤان هەرکی



# 📕 نامیلکەی

🌹 (( چەند بنچینەیەک لە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە )) 🌹

**پێشەکی:**

دوای خوێندنەوەی ئەم نامیلکەیە بە باشم زانی وەری بگێڕم بۆ زمانی کوردی و خوشکان و برایانی زێدە ئەزیزیشم سوودی لێ وەربگرن و زیاتر ئەهلی سوننە و جەماعە بناسن، لە ڕاستیدا نووسەر کەسێکی عەقیدە پاک نییە، بۆیە پێویستە تەحذیر بکرێ لە نوسراوەکانی بۆ ئەوەی کەس نەکەوێتە داوی عەقیدەکەیەوە فاشیلەکەیەوە، بەڵام بە وردی سەرنجم دایە ئەم نامیلکەیەی نووسەر شتێکی ئەوتۆی تێدا نەبوو لە ڕووکەشدا کە زیانی هەبێ بۆ کەسی عەقیدە پاک، ئیتر الله زانا ترە بە باطن، وە لە ڕاستیدا من هەموو نامیلکەکەم وەکو خۆی نەگەیاندووە، بەڵکو بە پێی پێویست دەستکاریەکم کردووە، وبالله التوفیق.

کۆمەڵی ڕزگاربوو ئەهلی سوننە و جەماعە

ئیمانداران لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) یەک ئوممەت بوون هەروەکو الله تعالى فەرموویەتی: إِنَّ هَٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ (سوڕەتی الأنبياء ـ ٩٢)
ئەمە سەرەڕای هەوڵەکانی جولەکە و مونافیقەکان بۆ تەفرەقە خستنە نێو مووسڵمانان لە سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، مونافیقەکان ووتیان: لَا تُنفِقُوا عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا (سوڕەتی المنافقون: ٧)
واتە: ماڵ و سامان مەبەخشن بەو کەسانەی کە لە دەوری پێغەمبەری خوادان، تا بڵاوەی لێ بکەن.

خوای گەورەش لە وەڵامیاندا فەرمووی: وَلِلَّهِ خَزَائِنُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ( سوڕەتی المنافقون: ٧)
واتە: ئەی نازانن هەرچی گەنجیەنەکان هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەر خوا خاوەنیانە، بەڵام دووڕوەکان ئەم ڕاستیە تێناگەن و لە نهێنیەکان سەردەرناکەن.

بەهەمان شێوە جولەکە ویستیان تەفرەقە بخەنە نێو مووسڵمانان و هەڵیانگەڕێننەوە لە ئیسلام، خوای تعالى دەفەرمویێت: وَقَالَت طَّائِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمِنُوا بِالَّذِي أُنزِلَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَجْهَ النَّهَارِ وَاكْفُرُوا آخِرَهُ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ (سوڕەتی آل عمران: ٧٢)
واتە: دەستەیەک لە خاوەن کتێبەکان (جووەکان) وتیان بەتاقمێکیان: ئێوە لە سەرەتای ڕۆژدا (بەدرۆوە) ئیمان و باوەڕ بهێنن بەو (قورئانەی) بۆ ئیمانداران ڕەوانە کراوە، بەڵام لەکۆتایی ڕۆژداو دەمەو ئێوارە پەشیمان ببنەوە (تا دوودڵی و گومانیان تێدا دروست ببێت) بۆ ئەوەی پاشگەز ببنەوە.

بەڵام پیلانەکەی جولەکەش سەری نەگرت چونکە الله ئاشکرای کردن و فەضحی

کردن، دووباره هەوڵیان دایەوە و ویستیان ئەمجارە دژایەتی و شەڕەکانی پێش ئیسلام بخەنەوە بیری پیشتیوانان (الأنصار)، بەڵام خوای گەورە فەرمووی: يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تُطِيعُوا فَرِيقًا مِّنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ كَافِرِينَ * وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ آيَاتُ اللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُ وَمَن يَعْتَصِم بِاللَّهِ فَقَدْ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ * يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ * وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ * وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ * وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ * يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ (سورەتی آل عمران: ١٠٠ تا ١٠٦)

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر گوێڕایەڵی هەندێک لەوانە بین کە کتێبی (ئاسمانییان) پێدراوە، دوای ئەوەی کە ئێوە باوەڕتان هێناوە، دەتانگێڕنەوە سەر ڕێبازی کوفرو بێ باوەڕی * جا ئێوە چۆن کافر دەبن لە کاتێکدا کە ئایەتەکانی خواتان بەسەردا دەخوێنرێتەوە و پێغەمبەرەکەی لەناوتاندایە (دوای وەفاتیشی (صلی الله علیه وسلم) بەسیرەتی پاک و بێگەردی هەر لەناوماندایە) جا ئەوەی پشت بەخوا ببەستێت و پیرەوی لە بەرنامەکەی بکات، ئەوە بەڕاستی بۆ ڕێگەو ڕێبازێکی ڕاست و دروست هیدایەت دراوە * ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، لە خوا بترسن و پارێزکاربن بە شێوەیەکی وا کە شایستەی ئەو زاتەیە و هەمیشە پابەند و دامەزراو بن لەسەر ئیسلامەتی، بۆ ئەوەی هەر کاتێک مردن بە ئیمان و ئیسلامەتی نەبێت نەمرن * (هەوڵ بدەن) هەر هەموتان بە توندی دەست بگرن بە ئاینی خواوەو پەرت و بڵاو مەب، یادی نازو نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان، (چونکە کاتی خۆی دوژمنی یەکتر بوون، ئەوە بوو دڵەکانتانی بەهۆی نیعمەتی (ئیسلامەوە) پەیوەست کرد بەیەکەوە و هەموو بوونە برای یەکتر (هەروەها ئەو کاتە) ئێوە لەسەر لێواری چاڵێکی ئاگر وەستا بوون و (خەریک بوو بکەونە ناوی)، باڵام خوا (بەڕەحم و میهرەبانی خۆی) لەو ئاگرە ڕزگاری کردن، ئابەو شێوەیە خوا

ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بۆ ئەوەی هیدایەت وەربگرن * پێویستە لە ئێوە ئومەتێک پێک بێت، یاخود با هەمووتان ئومەتێک بن کە بانگەواز بکەن بۆ خێرو چاکە، فەرمان بدەن بەهەموو کارێکی باوو دروست، قەدەغەی هەموو نادروستیەک بکەن، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن * نەکەن وەکو ئەوکەسانە بن کە ناکۆکی و دووبەرەکیان لەناودا بەرپابوو، لەیەکتر دابڕان، دوای ئەوەی ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوونەیان بۆ هاتبوو (کە سەرکەوتن لە یەک ڕیزیدایە)، ئا ئەوانە سزایەکی گەورە و سەخت چاوەڕێیانە * ڕۆژێک دێت ڕووخسارانێک سپی دەبن و ڕووخسارانێک ڕەش هەڵدەگەڕێن، جا ئەوانەی کە ڕووخساریان ڕەش هەڵگەڕاوە (پێیان دەوترێت): باشە، ئەوە ئێوە پاش ئیمانداریی، پەشیمان بوونەوە و ڕێبازی کوفرتان گرتەبەر؟! دە بچێژن سزاو ئازار بەهۆی کافر بوونتانەوە.

ئیتر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هات بۆ لای پشتیوانان و باسی نیعمەتی ئیسلامی بۆ کردن، دواتر پشتیوانان باوەشیان کرد بە یەکتردا.
(تفسير إبن الكثير ـ أسباب النزول للواحدى لاپەڕە ١٤٩ و ١٥٠)

دووبارە جولەکەکان شکستیان هێنا و مووسڵمانان هەر بە یەک ئوومەتی مانەوە، وە الله تعالى فەرمانی پێکردن (واتە فەرمانی کرد بە مووسڵمانان) کە کۆبنەنەوە لەسەر حەق و نەهی کرد لە ڕا جیایی (إختلاف) لە نێوانیاندا و فەرمووی: وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا من بَعْد مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ( سوڕەتی آل عمران: ١٠٥)
واتە: نەکەن وەکو ئەوکەسانە بن کە ناکۆکی و دووبەرەکیان لەناودا بەرپابوو، لەیەکتر دابڕان، دوای ئەوەی ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوونەیان بۆ هاتبوو (کە سەرکەوتن لە یەک ڕیزیدایە)، ئا ئەوانە سزایەکی گەورە و سەخت چاوەڕێیانە.
وە فەرموویەتی: وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا (سوڕەتی آل عمران ـ ١٠٣)
واتە: هەر هەموتان بە توندی دەست بگرن بە ئاینی خواوەو پەرت و بڵاو مەبن.

پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) هەمیشە جەختی لەسەر یەک ئوممەتی دەکردەوە و نەهی دەکرد لە پەرت و بڵاوبونەوە و ڕا جیایی، وە هەواڵی دا بەم ئوممەتە دەربارەی پەرت و بڵاوبونەوە و دابەشبوونی ئوممەتەکانی تر، کە دەفەرموێت: ئەوەی لە ئێوە بمێنێ ناکۆکیەکی زۆر دەبینێ، ئاگاداری سوننەتەکانی من و سوننەتەکانی خەلیفە ڕاشیدینە ڕێنمایی کراوەکانی دوای من.
الترمذی بە ژمارە ٢٦٧٦ ـ سنن أبو داود بە ژمارە ٤٦٠٧ ـ سنن إبن ماجة ٥٥ ـ المسند الإمام أحمد بەرگی چوارەم لاپەڕە ١٢٦.

وە دەفەرموێ: جولەکە بوون بە ٧١ تاقم و گرووپ، گاورەکان بوون بە ٧٢ تاقم و گرووپ، ئوممەتەکەی منیش دەبن بە ٧٣ تاقم و گرووپەوە، هەموویان لە ئاگردان ئیللا دانەیەکیان نەبێ، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا کامەیانە ؟ فەرمووی: ئەوەی لەسەر ئەوەبێت کە من و هاوەڵەکانم لەسەرین.
الترمذی ٢٦٤٠ ـ سنن أبو داود ٤٥٩٦ ـ سنن إبن ماجة ٣٩٩١ ـ مسند الإمام أحمد بەرگی دووەم لاپەڕە ٣٣٢.

وە ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) هەواڵی پێداین لەسەری ڕاست دەرچوو و هاتەدی، ئوممەت لە کۆتاییەکانی سەردەمی هاوەڵاندا تەفرەقەی تێکەوت، بەڵام ئەم تەفەروقە زۆر کاریگەری نەبوو لەسەر یەکگرتوویی و تەبایی ئوممەت لە ٣ سەدە زێڕینەکەدا کە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) دەربارەی فەرموویەتی: چاکترین خەڵکانی ئوممەت ئەوانەن کە لەم سەدەیەدان، دواتر چینی دوای ئەمان، دواتر چینی دوای ئەوان.
البخاري ٢٥٠٨ ـ مسلم ٢٥٣٥ ـ الترمذي ٢٢٢٢ ـ النسائی ٣٨٠٩ ـ سنن أبی داود ٤٦٥٧ ـ مسند إمام أحمد ٤/٤٢٧

دوای تەواو بوونی ماوەی سەدە ئاڵتونیەکان، مووسڵمانان تێکەڵی کافران بوون وە کتێب و زانستەکانی میللەتی کافران وەرگێڕدران و کرانە عەرەبی، کاربەدەستانی

مووسڵمانان کافرانیان هێنا و کردیاننه وەزیر و ڕاوێژکار، خیلاف و ڕاجیایی تا دەهات توندتر دەبوو، کۆمەڵ و فیرقە گومڕاکان زیاد بوون، وە ئەوەش تا ئەم سەردەمە بەردەوامە و بەردەوامیش دەبێ هەتا ئەوکاتەی الله دەیەوێ.

بەڵام سوپاس بۆ خوا کۆمەڵی ڕزگاربوو ئەهلی سوننە و جەماعە ماوەتەوە بە دەستگرتوییان و مانەوەیان لەسەر ئیسلامی ڕاست و درووست، لەسەری دەڕوات وە بانگەشەی بۆ دەکات، وە دەمێنێتەوە و ناسڕدرێتەوە، چونکە پێغەمبەری الله ئەوەی پێ فەرمووین و مژدەی پێداوین، ئەمەش لە فەزڵی الله یە.

ئەم کۆمەڵە پیرۆزە لەسەر ئەوەن کە هاوەڵان (رضی الله عنهم) و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەسەری بوون لە ووتە و کردەوە و بیروباوەڕ، هەروەکو پێغەمبەر دەربارەی کۆمەڵی ڕزگاربوو فەرموویەتی: ئەوەی لەسەر ئەوەبێت کە من و هاوەڵەکانم لەسەرین.
الترمذی ٢٦٤٠ ـ سنن أبو داود ٤٥٩٦ ـ سنن إبن ماجة ٣٩٩١ ـ مسند الإمام أحمد بەرگی دووەم لاپەڕە ٣٣٢.
هەروەها الله تعالی دەفەرموێ: فَلَوْلَا كَانَ مِنَ الْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُولُو بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ الْفَسَادِ فِي الْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ وَاتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَا أُتْرِفُوا فِيهِ وَكَانُوا مُجْرِمِينَ (سوڕەتی هود: ١١٦)
واتە: جا ئەوە بۆ لەناو خەڵکی زەمانی پێش ئێوەدا کەسانی ژیرو دیندار نەبوو، کە بەرگریان لە خراپەو تاوان بکردایە لە زەویدا، مەگەر کەمێک نەبێت لەوانەی کە ڕزگارمان کردن لێیان، چونکە زۆربەیان لە سنووری فەرمانی خوا دەرچوون و شوێن ڕابواردنی دنیاو ئارەزوو کەوتن، ئیتر بەو کردەوە ناشیرینەیان چوونە ڕیزی تاوانبارو خراپکارانەوە.

## ناوەکانی کۆمەڵی ڕزگاربوو و واتاکانی:

چەند ناوێکی هەیە لەوانە: کۆمەڵی ڕزگاربوو ـ کۆمەڵی سەرکەوتوو ـ ئەهلی سوننە و جەماعە

کۆمەڵی ڕزگاربوو: مانای ئەم ناوە ئەوەیە کە ڕزگاری بووە لە ئاگر، وەکو پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەربارەی ٧٣ فیرقەکە ووتی: هەموویان لە ئاگردان ئیللا دانەیەکیان نەبێ.
کەواتە لە ئاگردا نین.

دەست گرتوون بە قورئان و سوننەت: هەروەکو پێشینانی ئوومەت و هاوەڵان لە کۆچکردووان و پشتیوانان (ڕەحمەتی خوایان لێبێ) دەستیان گرتووە بە قورئان و سوننەت، هەروەکو پێغەمبەر فەرمووی دەربارەیان: لەسەر ئەوەن کە من و هاوەڵەکانم لەسەرین.
"پێشتر تەخریجەکەی دانراوە"

ئەهلەکەی ئەهلی سوونەت و ئەهلی جەماعەتیشن: دەستیان گرتووە بە سووننەتی رسول الله و پێوەی پابەندن، بە پێچەوانەی گرووپەکانی تر کە دەست گرتوون بە بیروبۆچونەکانیانەوە و ووتەکانیان و هەوا و ئارەزووی خۆیان، وە ووتەکانیان و بیروبۆچونیان (عەقیدەیان) ناگەڕێتەوە سەر سووننەت و ئیسلامی ڕاست و درووست، وەکو قەدەرییەکان و مورجیئەکان و جەهمییەکان و ڕافیزەکان و خەواریجە قەبیحەکان (قاتلهم الله جمیعا)، وە ئەمانە ئەهلی جەماعەتن، الحمدلله لەسەر حەق کۆدەبنەوە و خیلافە بچووکەکانیش وەلا دەنێن، کە ئەمەش جیاوازیە لە نێوان ئەهلی سوننە و جەماعە لەگەڵ گرووپەکانی تردا چونکە ئەوان لەسەر حەق کۆنابنەوە بەڵکو لەسەر هەوا و ئارەزوویان کۆدەبنەوە.

کۆمەڵی سەرکەوتوون هەتا هەستانی قیامەت: خوای گەورە دەفەرموێ: إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ (سورەتی محمد: ٧)
واتە: ئەگەر ئێوە پشتیوانی لە ئاینی خوا بکەن و هەوڵی سەرکەوتنی بدەن، ئەوەخوایش پشتیوانی لەئێوە دەکات و سەرتان دەخات و پایەدارو جێگیرتان دەکات.

---

👈 بنچینەکانی ئەهلی سوننە و جەماعە:

ئەهلی سوننە و جەماعە لەسەر چەند بنچینەیەکی چەسپاو و ڕوون دەڕۆن لە بیروباوەڕ و کردار و سلوک، وە ئەم بنچینە گرنگ و گەورەیە پەیوەستن بە قورئان و سوننەت، وە ئەوەی پێشینی ئوممەت لەسەری بوون، هەروەها تابعیەکان و تابعی تابعیەکانیش (رحمهم الله جميعا).

①بنچینەی یەکەم:

باوەڕ بوون بە الله و فریشتەکان و کتێبە ئاسمانییەکان و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایی، وە باوەڕ بوون بە قەدەر بە خێر و شەڕییەوە

١- ئیمان هێنان بە الله: دان نانە بە ٣ جۆرەکەی تەوحید (الربوبية - الألوهية - الأسماء والصفات) و قبوڵ کردنی و کار کردن پێی، وە مانای تەوحیدی ڕبوبیەت ئەوەیە کە الله بە تاک دابنێی لە کارەکانیدا وەکو درووست کردن و ڕزق دان و زیندوو کردنەوە و مراندن، وە ئەو خاوەن هەموو شتێکە، وە تەوحیدی ئولوهیەت مانای ئەوەیە کە الله بە تاک دابنێیت لەو کارانەی کە پێی نزیک دەبیتەوە لە الله، وەکو پاڕانەوە و ترسان و خۆشەویستی و سەر بڕین و نەزر و پەنا گرتن و نوێژ و ڕۆژوو و حەج و هتد...، وە تەوحیدی ناو و سیفەت مانای ئەوەیە کە ئەو ناو و سیفەتانە بچەسپێنیت کە الله بۆ خۆی چەسپاندووە، وە چەسپاندنی ئەو ناو و سیفەتانەش کە لە فەرموودە صەحیحەکاندا هاتووە، بەبێ پەکخستن و تەئویل و وێکچواندن و تەمثیل، وەکو خوای تعالى دەفەرموێ: لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ (سورەتی الشوری: ١١)
واتە: هیچ شتێک نیە لە وێنەی ئەو زاتە.
وە دەفەرموێ: وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا (سورەتی الأعراف - ١٨٠)
واتە: هەر بۆ خوایە هەموو ناوە جوان و پیرۆزەکان، جا (ئەی ئیمانداران)بەو ناوانە دۆعا و نزا بکەن و هاناو هاوار بۆ ئەو زاتە بەرن.

٢- باوەڕ بوون بە فریشتەکان (الملائكة): مانای ئەوەیە کە دان بنێی بە بوونی فریشتەکان و وە یەکێکن لە درووستکراوەکانی خوای تعالى و لە نور درووستی کردوون بۆ پەرستنی خۆی و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی لە کەون، خوای گەورە دەفەرموێ: وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَٰنُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَلْ عِبَادٌ مُكْرَمُونَ * لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ (سورەتی الأنبياء: ٢٦ و ٢٧)
واتە: خوانەناسان دەیانوت: خوای میهرەبان کوڕی بۆ خۆی بڕیارداوە (فریشتەکان

ڕۆڵەی ئەون)، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەیە، بەڵکو ئەوانە بەندەی ڕێزداری ئەون * (ئەو فریشتانە ئەوەندە ڕەوشت بەرزن) هەرگیز (نافەرمانی ناکەن و) قسە لەقسەیدا ناکەن و لە گوفتاردا پێشی ناکەون، ئەوانە بە فەرمانی ئەو دەجوڵێنەوە و فەرمانی ئە جێبەجێ دەکەن.

وە دەفەرموێ: الْحَمْدُ للّه فَاطرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ جَاعلِ الْمَلَائكَةِ رُسُلًا أُولى أَجْنحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ يَزِيدُ فى الْخَلْقِ مَا يَشَاءُ إِنَّ اللّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ (سوڕەتی فاطر: ١)

واتە: سوپاس وستایش بۆ خوایە، کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویە، فریشتەکانی کردووە بە فرستادەی خۆی کە خاوەنی چەندەها باڵن، هەیانە دوو، یان سێ، یان چوار باڵە، لە دروستکردندا هەرچی بوێت زیادی دەکات (لە ژمارەی فریشتەکان، لە ئەستێرە و هەسارەکان، لە ئادەمیزاد و پەری... هتد) بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

٣- باوەڕ بوون بە کتێبە ئاسمانییەکان: واتە دان نان بە حەق بوونی ئەو کتێبانە و ئەوەشی لەناویدایە هیدایەتە، وە الله دایبەزاندووە لەسەر پێغەمبەرەکانی (علیهم الصلاة والسلام) کە هیدایەتی مرۆڤیمێ بدەن، گرنگترینیان تەورات و ئینجیل و قورئانە، گرنگترینیان لەو ٣ کتێبەش قورئانە، وەکو خوای تعالی دەفەرموێ: قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَىٰ أَن يَأْتُوا بمِثْلِ هَٰذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بمِثْلهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لبَعْضٍ ظَهِيراً (سوڕەتی الإسراء: ٨٨)

واتە: ئەی محمد صلى الله عليه وسلم پێیان بڵێ: سوێند بە خوا ئەگەر هەموو ئادەمیزادو پەریەکان کۆ ببنەوەو (هەوڵی بەردەوام بدەن تا) قورئانێکی وەکو ئەمە دانێن و بیهێننە (مەیدان) ناتوانن کاری وابکەن و ناتوانن لە وێنەی بهێنن، ئەگەر چی هەموو لایەکیان ببنە پشتگیرو یارمەتیدەری یەکتر.

وە ئەهلی سوننە و جەماعە بڕوایان وایە کە قورئان ووتەی خوایە و مەخلوق نییە، بە ڕاجیایی لەگەڵ جەهمی و موعتەزیلە کافرەکان کە دەڵێن قورئان مەخلوقە هەموو واتا و ووشەکانی، الله تبارک وتعالی دەفەرموێ: وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللّه ثُمَّ أَبْلغْهُ مَأْمَنَهُ ذَٰلكَ بأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ (سوڕەتی التوبة - ٦)

واتە: خۆ ئەگەر کەسێک لە هاوەڵگەران داوای پەنای لێ کردیت (ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەی ئیماندار)، ئەوە تۆیش پەنای بدە هەتا گوێی لە فەرموودەکەی خوا (قورئان) دەبێت، پاشان بیگەیەنە بەو شوێنەی دەیەوێت و (ماڵ و گیان و ژیانی) تیایدا پارێزراوە، ئەم میهرەبانیە لەبەر ئەوەیە ئەوانە کەسانێکن نازانن (خواناسی چیە).

وه دەفەرموێ: يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا كَلَامَ اللَّه (سورەتی الفتح: ١٥)
واتە: ئەمانە دەیانەوێت ووتەی خوا بگۆڕن.

٤- باوەڕ بوون بە پێغەمبەران: واتە دان نان بە هەموویان، بەوانی الله ناوی هێناون و بەوانەشی کە ناوی نەهێناون، کە کۆتاییەمینیان محمد ە (صلی الله علیه وسلم) وە هیچ پێغەمبەرێکی تر لە دوای نایەت، ئەوەی بیروڕای وا نەبێ کافرە، وە نابێ زێدەڕۆیی (غلو) بکەین لە هیچ پێغەمبەرێکدا، بە خیلاف لەگەڵ یەهود و نەصارا کە پێغەمبەرانیان کردە کوڕی خوا (والعیاذ بالله)، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّه وَقَالَتِ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللَّه (اسورەتی التوبة: ٣٠)
واتە: جولەکە وتیان: عوزەیر کوڕی خوایە، گاورەکانیش وتیان: مەسیح کوڕی خوایە.

وە صۆفی و فەلسەفەچییەکان لە حەقی پێغەمبەرانیان کەم کردەوە و زانا و گەورەکانی خۆیان پێشخست بەسەر پێغەمبەراندا (علیهم أفضل الصلاة والسلام)، وە یەهود کوفریان کرد بە عیسا و محمد، وە نەصارا کوفریان کرد بە موسی و محمد، جا ئەوەی باوەڕ بە هەندێکی بێنێت و بێ باوەڕ بێت بە هەندێکی ئەوا بێباوەڕە بە هەموویان، خوای تعالی دەفەرموێ: إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّه وَرُسُلِه وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّه وَرُسُلِه وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا * أُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا (سورەتی التوبة: ١٥٠ و ١٥١)
واتە: بێگومان ئەوانەی باوەڕ بە خواو پێغەمبەران ناهێنن و دەیانەوێت جیاوازی بکەن لە نێوان خواو پێغەمبەرەکانیدا (گوایە باوەڕیان بەخوا هەیە بەڵام باوەڕیان بەپێغەمبەران نیە)، (یاخود) دەڵێن: باوەڕ دەهێنین بەهەندێک لە پێغەمبەران و باوەڕ بەهەندێکیان ناهێنین و دەیانەوێت لەو نێوانەدا ڕێگە و بەرنامەیەک بۆ خۆیان بەدەست بهێنن * ئا ئەو کەسانە بەڕاستی هەر بێ باوەڕن و بۆ بێ باوەڕان سزایەکی سەر شۆڕکەرمان ئامادەکردوە.

٥- باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی: واتە دان نان بە هەموو شتێک لە دوای مردن، لەوەی کە الله و نێردراوەکەی (صلی الله علیه وسلم) هەواڵیان پێداوین لە عەزابی قەبر و زیندوو بونەوە و حەشر کردن و حیساب و کیتاب، وە دانی کتێبی کارەکانت بە دەستی ڕاست یاخود چەپ، وە ڕێگای بەهەشت و دۆزەخ، وە خۆ ئامادە کردن بۆی بە ئەنجامدانی کارە خێر و

چاکەکان، وە دوورکەوتنەوە لە کارە نەشیاو و خراپەکان، وە تەوبە کردن لێیان، وە دەهریەکان و مووشریکەکان باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نییە، وە یەهود و نەصارا باوەڕیان پێ نەهێنا بە باوەڕێکی ڕاست و درووست، خوای گەورە دەفەرموێ: وَقَالُوا لَن يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَارَىٰ (سوڕەتی البقرة: ١١١)

واتە: (جوولەکە و گاورەکان) دەڵێن: هەرگیز کەس ناچێتە بەهەشتەوە بێجگە لە جوولەکە یان گاور.

وە دەفەرموێ: قَالُوا لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلَّا أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ (سوڕەتی آل عمران: ٢٤)

واتە: ڕاستی ئەوان دەیانووت: هەرگیز ئاگری دۆزەخ چەند ڕۆژێکی کەم نەبێت بەر لەشمان ناکەوێت.

٦- ئیمان هێنان بە قەدەر: واتە باوەڕ بوون بەوەی کە الله زانایە بەوەی دەبێ و دەشبوو، کە لە لوح المحفوظ دایە، وە هەموو شتێ کە ڕوودەدات لە خێر و شەڕ لە کوفر و ئیمان، لە چاک و خراپ ئەوا الله ویستی لەسەر بووە، خوای گەورە دەفەرموێ: وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ (سوڕەتی سوڕەتی التکویر: ٢٩)

واتە: ویستی ئێوەش نایەتە دێتە دی مەگەر کاتێک خوای پەروەردگاری جیهانیان بیەوێت، (هەرکەس ویستی خێری هەبێت خوای گەورە سەربەرستی لێ زەوت ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەوە پێش دێت کە ویستی خوای لەسەرە و توانای تێگەیشتنمان لە نهێنی و شاراوەکان زۆر سنووردارە).

②بنچینەی دووەم:

بنچینەیەکی تری ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوەیە کە ئیمان ووتە و کردەوە و بیروباوەڕە، زیاد دەکات بە خێر و چاکە، کەم دەکات بە سەرپێچی و تاوان، وە ئیمان گەر ووتە و کردەوە بێت و بیروباوەڕی لەگەڵدا نەبێ ئەوا ئەمە ئیمانی مونافیقەکانە، وە ئیمان هەر زانین نییە بەبێ کردەوە و ووتە، چونکە ئەمەش ئیمانی کافرە ئینکاری کەرەکانە، خوای گەورە دەفەرموێ: وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ (سوڕەتی النمل: ١٤)

واتە: جا ئەوانەی هەر ڕق ئەستوورییان کردو باوەڕیان پێی نەبوو، بە زۆرداری و

خۆبەزلزانی، لە کاتێکدا لە ناخی دەروونیانەوە هەستیان دەکرد حەقیقەتەو ڕاستە، دە تەماشا بکە و سەرنج بدە بزانە سەرەنجامی تاوانباران و گوناهکاران چۆن بوو (چۆن تۆڵەمان لێ سەندن).

وە دەفەرموێ: قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِى يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ (سورەتی الأنعام: ٣٣)

واتە: بەڕاستی چاک دەزانین کە گوفتاری نادروستی خوانەناسان غەم و پەژارەت بۆ پێش دەهێنێت، چونکە بەڕاستی ئەوانە وەنەبێت تۆ بەدرۆزن بزانن، بەڵکو ستەمکاران هەر داننانێن و ئینکاری ئایەت و فەرمانەکانی خوا دەکەن.

وە دەفەرموێ: وَعَادًا وَثَمُودَ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَاكِنِهِمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَكَانُوا مُسْتَبْصِرِينَ (سورەتی العنكبوت: ٣٨)

واتە: هەروەها ( عاد ) ی قەومی ( هود ) و ( ثمود ) ی قەومی ( صالح ) یشمان لەناو برد کە ئاشکرا بوو بۆتیاچوونیان لە شوێنەواری کاولیانەوە، شەیتانیش کردەوەی نادروست و ناپەسندیانی بۆ ڕازاندبونەوە، لە ڕێگا و ڕێبازی ڕاست و دروست وێڵی کردبوون، لەکاتێکدا ئەوان خاوەنی عەقڵ و بیر و هۆشیش بوون.

وە ئیمان تەنها بیروبڕوا نییە، یان بیروبڕوا و ووتە بە تەنها و بەبێ کردار، چونکە ئەمەش ئیمانی مورجیئەیە، الله تعالى زۆرێک لە کردەوەکانی بە ئیمان داناوە، بۆ نموونە: الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ * أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ (سورەتی الأنفال: ٣ و ٤)

واتە: ئەوانەن کە نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن، هەندێک لەو ڕزق و ڕۆزیەی پێمانداون، دەبەخشن و سەرفی دەکەن... * ئا ئەوانە هەر خۆیان ئیماندارانی ڕاستەقینەن، چەندەها پلەوپایەی بەرزیان بۆ هەیە لای پەروەردگاریان و لێخۆش بوون و ڕزق و ڕۆزی هەمیشەیی لەگەڵ ڕێزدا.

وە خوای تعالى نوێژی مووسڵمانانی بە ئیمان داناوە لەو کاتەی کە قیبلەیان قودس بووە: وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ (سورەتی البقرة: ١٤٣)

واتە: بێگومان خوا ئیمان و باوەڕداریی و (نوێژتان) زایە ناکات.

③بنچینەی سێیەم:

یەکێک لە بنچینەکانی تری ئەهلی سوننە و جەماعە تەکفیر نەکردنی مووسڵمانە، ئیللا ئەگەر کەوتبێتە یەکێک لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام، ئەمما ئەوەی تاوانە گەورەکان ئەنجام دەدات و دەکەوێتە ناوی تەکفیر ناکرێ و کافر نییە، بەڵکو فاسقە و ئیمانی کەم و کورتی تێدایە، وە ئەگەر تەوبەی لێ نەکات ئەوا الله گەر ویستی لەسەر بێت ئەوا لێی خۆشدەبێت لەسەری، وە گەر ویستیشی لەسەر بێت ئەوا سزای دەدات و لەسەری، بەڵام بۆ هەتا هەتایە لە ئاگردا نامێنێتەوە، خوای تعالی دەفەرموێ: إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَىٰ إِثْمًا عَظِيمًا (سورەتی النساء: ٤٨) واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت، بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت، جا ئەوەی هاوەڵ و شەریک بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە ئیتر بەڕاستی تاوانێکی گەورەی هەڵبەستووە.

وە الحمدلله عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە نێوەندگیرە لەنێوان عەقیدەی خەواریجەکان کە ئەو کەسەی بکەوێتە ناو تاوانی گەورە تەکفیری دەکەن و مورجیئەکانیش بە کەسێکی کامل ئیمانی دەزانن و دان نانێن بە کەم بوونی یان زیاد بوونی.

④ **بنچینەی چوارەم:**

**یەکێکی تر لە بنچینەکانی تری ئەهلی سوننە و جەماعە بە واجب دانانی گوێڕایەڵی کردنی کاربەدەست و حاکمە مووسڵمانەکانە ئیللا گەر فەرمانیان بە خراپە کرد، وە ئەگەر فەرمانیان بە خراپە کرد ئەوا گوێڕایەڵی کردنیان جائیز نییە، گوێڕایەڵی کردنیان تەنها لە سنوری فەرمان کردنە بە چاکەدا (الأمر بالمعروف)، خوای گەورە دەفەرموێ: يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ (سورەتی النساء: ٥٩)**
**واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەردارو گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرو فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خودی خۆتانن.**
**وە پێغەمبەری الله (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ئامۆژگاریتان دەکەم بە تەقوای خوا و گوێڕایەڵی کردنی، وە ئەگەر بەندەیەکیش فەرمانی پێ کردن.**
**سنن الترمذي بە ژمارە ٢٦٧٦ - سنن إبن ماجة بە ژمارە ٤٤ - المسند إمام أحمد ٤/١٢٦.**
**وە ئەهلی سوننە و جەماعە سەرپێچی کردنی ئەمیر و کاربەدەست بە سەرپێچی کردنی پێغەمبەر دەزانن وەکو کار کردنێک بە فەرموودەی پێغەمبەر، وەکو فەرموویەتی: ئەوەی گوێڕایەڵی ئەمیر بکات ئەوا گوێڕایەڵی کردووم، ئەوەی سەرپێچی ئەمیر بکا ئەوا سەرپێچی کردووم.**
**البخاری ٢٧٩٧ - مسلم ١٨٣٥ - سنن النسائی ٤١٩٣ - سنن إبن ماجة ٢٨٥٩ - المسند لإمام أحمد ٢/٣٨٧**

**(تێبینییەکی گرنگ: مەبەست لەم ئایەت و فەرموودانەدا پێشەوا و ئەمیری مووسڵمانە، کە بە شەریعەتی الله کاردەکات، نەوەک عەلمانییەکان و لیبراڵیەکان و دیمووکراسیەکان، حاشا ئەوانە نە الله، نە نێردراوی الله فەرمانیان پێ نەکردووین کە گوێڕایەیان بکەین، بەڵکو قیتال و کوشتاریان واجبە).**

⑤**بنچینەی پێنجەم:**

**بنچینەیەکی تر بە حەرام دانانی دەرچوون و خروجە لە حاکم و کاربەدەستی مووسڵمان، هەتا ئەوکاتەی کوفری ڕوون و ئاشکرای لێ دەبینرێت، ئەمەش بە خیلاف لەگەڵ موعتەزیلە کە دەرچوون و خروج بە واجب دەزانن کە ئەمیر و کاربەدەست کەوتە ناو تاوانی گەورە و ئەگەریش کوفر نەبوو، موعتەزیلە ئەم کارە لە فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە دەبینن، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم کارەی موعتەزیلە لە گەورەترین خراپەکانە.**

---

⑥**بنچینەی شەشەم:**

**دڵ و زمانیان پارێزراوە لە هاوەڵانی پێغەمبەر (رضی الله عنهم) کە ئەمەش بنچینەیەکی تری عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەیە، خوای گەورە دەفەرموێ: وَالَّذِينَ جَاءُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ (سورەتی الحشر: ١٠)**
**واتە: ئەوانەش کە بە شوێن کۆچبەران و پشتیوانەکاندا هاتن (تا کۆتایی دنیا ئەمە دۆعا و نزایانە و بەردەوام) دەڵێن: پەروەردگارا لە ئێمە و لە برایانەشمان خۆش ببە کە پێش ئێمە ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر و لە دڵەکانماندا هیچ جۆرە بوغزو کینەیەک مەخەرە دڵمانەوە لە ئاستی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، پەروەردگارا تۆ بەڕاستی بەسۆزو بەخشندە و میهرەبانیت.**

**وە پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: جنێو و قسە مەڵێن بە هاوەڵانم، بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر کەسێک لە ئێوە بەقەد کێوی ئوحود ئاڵتون ببەخشێ ناگاتە مشتێکیان بەڵکو نیوەشیان.**
**صحيح البخاري بە ژمارە ٣٤٧٠ ـ صحيح المسلم بە ژمارە ٢٥٤١ ـ سنن الترمذي بە ژمارە ٣٨٦١ ـ سنن أبو داود بە ژمارە ٤٦٥٨ ـ سنن أبو ماجە بە ژمارە ١٦١ ـ وە المسندی ئیمام أحمد لە بەرگی ٣ لاپەڕە ٥٥**

ئەمەش بە خیلاف لەگەڵ ڕافیزە و خەواریج کە قسە و جنێو بە هاوەڵان دەدەن و فەزڵی هاوەڵان (رضی الله عنهم) ڕەت دەکەنەوە، وە ئەهلی سوننە و جەماعە وای دەبینێ کە خەلیفە دوای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەبو بەکرە، دوای ئەویش عومەر و عوسمان و عەلی (رضی الله عنهم)، ئەوەی تانە بدات لە خیلافەتەکەیان ئەوا گومڕا و سەر لێ شێواوە، وە سەرپێچی دەق و کۆدەنگی زانایانی کردووە.

---

⑦بنچینەی حەوتەم:

یەکێکی تر لە بنچینەکان خۆشویستنی ئەهلی بەیتی پێغەمبەرە و پشتگیری کردنیانە، وە لە ئەهلی بەیت هاوسەرەکانی پێغەمبەرە کە دایکی ئیماندارانن (رضی الله عنهم)، خوای تعالی دەفەرموێ: يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ، دواتر ئامۆژگارییان دەکات و دەفەرموێ: وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا (سوڕەتی الأحزاب: ٣٣)
ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر (صلی الله علیەوسلم) لەماڵەکانی خۆتاندا بەسەنگینی و سەلاری بسرەون، زینەت و جوانی خۆتان دەرمەخن وەکوو سەردەمی نەفامی یەکەم، نوێژەکانیشتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکات بدەن (لەماڵ و سامان)، فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەشی بکەن، چونکە بەڕاستی خوا تەنها دەیەوێت هەموو ناپاکی و ناسازی و نادروستیەک لە ئێوە دوور بخاتەوە ئەی خاوخێزانی ماڵی پێغەمبەرو بەتەواوی پاکتان بکاتەوە (دوور لەهەموو ناتەواوی و قسەو قسەلۆکێک).

وە لێرەدا مەرج نییە کە هەموو کەسە نزیکەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کەسانی چاک و صاڵح بن، نەخێر بەڵکو أبو لهب و أبو جهل و مامەکانی پێغەمبەر چاک و صاڵح نەبوون، بەڵکو کافر بوون، خوای گەورە دەربارەی أبو لهب دەفەرموێ: تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ (سوڕەتی: المسد: ١)

واتە: دەستەکانی بشکێت ئەبو لەهەبو ڕسوا بێت، ئاشکرایە کە هەر ڕاسوایش دەبێت و (لەناو دەچێت).

وە کەسانی نزیک پێغەمبەر (لە بنەماڵە و خێزاندا) جگە لە مووسڵمانەکان پێغەمبەر ناتوانێ فریایان بکەوێت، پێغەمبەر لە دوای دابەزینی ئایەتی ٢١٤ ی سوڕەتی الشعراء قوڕەیشی بانگ کرد بە گشتی و چەند کەسێک بە تایبەتی و فەرمووی: ئەی نەوەی کەعبی کوڕی لوئەی خۆتان ڕزگار بکەن لە ئاگر، ئەی نەوەی موڕەی کوڕی کەعب، ئەی نەوەی عبدالشمس خۆتان ڕزگار بکەن لە ئاگر، ئەی نەوەی عبدالمناف خۆتان ڕزگار بکەن لە ئاگر، ئەی نەوەی هاشم خۆتان ڕزگار بکەن لە ئاگر، ئەی نەوەی عبدالمطلب خۆتان ڕزگار بکەن لە ئاگر، ئەی فاطمە خۆت ڕزگار بکە لە ئاگر، من لەلای خوا هیچ دەسەڵاتێکم نییە جگە لەوەی ڕەحم و بەزەیی هەیە لە نێوانماندا و دەیگەیەنم.
البخاري بە ژمارە ٢٦٠٢ ـ مسلم بە ژمارە ٢٠٦ ـ النسائی بە ژمارە ٣٦٤٦ ـ وە أحمد لە بەرگی دووەمی المسند لاپەڕە ٣٥٠ ـ وە الدارمی بە ژمارە ٢٧٣٢

وە کەسە مووسڵمانە صاڵحەکانی نزیک پێغەمبەر پێویستە خۆشمان بوێن و ڕێزیان لێ بگرین، وە نابێ زێدەڕەویان تێدا بکەین و شتێک لە پەرستش بۆ ئەوان ئەنجام بدەین، وە نابێ وا بیربکەینەوە کە ئەوان قازانج و زەرەر بگەیەنن ئیللا بە ویستی خوا نەبێ، خوای گەورە بە پێغەبەرەکەی دەفەرموێ: قُلْ إِنِّي لَا أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا (سوڕەتی الجن: ٢١)
هەروەها پێیان بڵێ: من هیچ جۆرە زەرەرو زیانێکم بەدەست نیە، هەروەها هیدایەتیش بەدەست من نیە (ئەگەر خۆتان بیر نەکەنەوە، قەناعەت بەزۆر نی یە).

وە دەفەرموێ: قُل لَّا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ (سوڕەتی الأعراف: ١٨٨)

واتە: (ئەی محمد(صلی الله علیه وسلم) پێیان بڵێ: کە من ناتوانم هیچ قازانج یان زەرەرێک بەخۆم بگەیەنم مەگەر ویستی خوای لەسەربێت، خۆ ئەگەر غەیب و شاراوەکانم بزانیایە ئەوە چاکەی زۆرم کۆدەکردەوە بۆخۆم و هیچ ناخۆشیەکیشم تووش نەدەبوو، من هیچ شتێک نیم تەنیا ترسێنەرێک (بۆ یاخیەکان) و مژدەدەریشم بۆ کەسانێک کە باوەڕ دەهێنن.

---

⑧بنچینەی هەشتەم و کۆتایی:

شوێنکەوتنی ئەوەی هاتووە لە کتێبی الله و سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە ڕووکەش و لە ناخیشدا یەکێکی ترە لە بنچینەکانی ئەهلی سوننە و جەماعە، وە شوێنکەوتنی ئەوەی هاوەڵان لە پشتیوانان و کۆچکردوان لەسەری بوون، وە خەلیفە ڕاشیدینەکان (رضی الله عنهم جمیعا)، هەروەکو پێغەمبەر وەسیەتی بۆ کردین و فەرمووی: شوێن سوننەتەکانی من و خەلیفە ڕێنموویی کراوەکان (ڕاشیدینەکان) بکەون.
الرمذي به ژماره ٢٦٧٦ - إبن ماجه ٤٤

وە نابێ ووتەی هیچ کەسێک پێش بخەین بەسەر ووتەی خوا و پێغەمبەرەکەیدا (صلی الله علیه وسلم)، هەر بەو هۆیەشەوە ناو نراون ئەهلی کیتاب و سوننەت، وە دوای قورئان و سوننەت دەست دەگرن بە کۆدەنگی زانایانی ئوممەت (إجماع)، وە ئەمە سێیەم بنچینەیە لە دوای دوو بنچینەکەی تر کە دەستی پێوە دەگرن، یەکەمیان قورئانە و دووەمیشیان سوننەت، وە ئەوەیشی ڕا جیایی تێدابێ ئەوا دەیگێڕنەوە بۆ قورئان و سوننەت وەکو کارکردنێک بەم ئایەتەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ:
فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِى شَىْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا (سورەتی النساء: ٥٩)
واتە: ئەگەر لە شتێکدا بوو بەکێشەتان دەربارەی حوکمی خوایی، ئەوە ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) (کە قورئان و سوننەت

دەگەیەنێت)، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەخواو بە ڕۆژی قیامەت هەیە، (ڕەفتارکردنتان بەو شێوەیە چاکترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری کێشەکانتان.

وە ئەهلی سوننە و جەماعە بیروڕایان وایە کە کەس جگە لە پێغەمبەر پارێزراو نییە لە هەڵە، وە ڕای هیچ کەسێک بە ڕاست و درووست نازانن ئیللا ئەگەر موافقی قورئان و سوننەت بێت، وە وای دەبینن کە کەسی موجتەهید هەڵە دەکات و دەپێکێ، وە ڕێگا نادەن بە ئیجتیهاد ئیللا ئەگەر مەرجەکانی تێدا بوو کە ناسراون لای ئەهلی عیلم، وە خیلاف لە پرسە ئیجتیهادیەکان شایەنی هەجر کردن و ڕق لێبوونەوە نییە لایان هەروەکو ئەهلی بیدەع ئەم کارە دەکەن.

وأخر دعوانا الحمدلله رب العالمين

